# بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت

وجبت له

## الجنة



إعداد
أبي عبد العزيز منير الجزائري

وەرگێڕانی

هشام لطيف البرزنجي

# وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ

الحَمْـدُ لله الَّـذِي جَعَـلَ جَنَّـاتِ الفِـرْدَوْسِ لِعِبَـادِهِ المُـؤْمِنِينَ نُـزُلَا، وَيَـسَّرَهُمْ لِلْأَعْمَالِ الصَّالِحَةِ المُوصِلَةِ إِلَيْهَا، فَلَمْ يَتَّخِذُوا سِوَاهَا شُغُلَا، وَسَهَّلَ لَهُمْ طُرُقَهَا، فَسَلَكُوا السَّبِيلَ المُوصِلَةِ إِلَيْهَا ذُلُلَا.

وَأَشْـهَدُ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَـه، شَـهَادَةَ عَبْـدِهِ وَابْـنِ عَبْـدِه وَابْـنِ أَمَتِه، وَمَنْ لَا غِنى لَهُ طَرْفَةَ عَيْنٍ عَنْ فَضْلِهِ وَرَحْمَتِه، وَلَا مَطْمَعَ لَهُ بِالفَوْزِ بِالجَنَّةِ وَالنَّجَاةِ مِنَ النَّارِ إِلَّا بِعَفْوِه وَمَغْفِرَتِه.

وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُه، وَأَمِينُهُ عَلَى وَحْيِهِ وَخِيرَتِه مِنْ خَلْقِه، أَرْسَلَهُ رَحْمَةً لِلْعَالَمِين، وَمَحَجَّةً للسَّالِكِين، وَحُجَّةً عَلَى العِبَادِ أَجْمَعِين، بَعَثَهُ لِلْإِيمَانِ مُنَادِيًا، وَإِلَى دَارِ السَّلَامِ دَاعِيًا، وَلِلْخَلِيقَةِ هَادِيًا، فَصَلَّى اللهُ عَلَيْه، كَمَا وَحَّدَ اللهَ وَعَبَدَه، وَعَرَّفَنَا بِهِ وَدَعَا إِلَيْه، وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحْسَانٍ إِلَى يَوْمِ الدِّين.

**لە پاشان:**

ئەی براکانم لە پێناو خوای گەورە ... ئێوەم خۆش دەوێت لەبەر خوای گەورە:

خوای گەورە منو ئێوەش بکات بە یەکێك لەو کەسانەی ئەهلی بەهەشتن: " پێکهاتووە لە ژووری بەرز،و ڕاخەری ڕازەوە،و دارو میوەکانیان بۆ نرم دەبێتەوە،و جێگاو ڕاخەری نەرمو ناسکیان لە شوێنی بەرز بۆ ڕاخراوە،و باخیان بۆ هەیە کە هەموو چاکەو شتێکی باشی تێدایەو ئافرەتانێکی تێدایە کە زۆر چاكو ڕەوشت بەرزن،و جۆرەها میوە،و هەر خواردنێك حەزی پێبکەن،و خواردنەوەی خۆش،و تەماشاکردنی دروستکراوی ئاسمانەکانو زەوی (کە خوای گەورەیە)، کە تێیدا دەمێننەوە بە هەتاهەتایی، نامرنو پیر نابنو نەخۆش ناکەون،و ناخەون، وە پیسی تێدانییە،و بەڵغەمو هیچ شتێکی لەوانە تێدانییە کە لە دوای خواردن بکرێت (وەکو میزو پیسایی) بەڵکو عارەق دەکەن کە بۆنەکەی وەکو میسك وایە". (١)

بەهەشت شوێنی تەقوادارانە، وە جێگەو مانەوەی پیاوچاکانە، کۆمەڵێك موشتاقو تامەزرۆی بوونو نەفسی خۆیانو ژیانێك کە نامێتو دەگۆڕێت فرۆشتیان، وە ژیانیاێکیان کڕی کە بەردەوامەو لەناوچوونی بەسەردا نایات:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَ﴾ [التوبة: ١١١] (٢).

---

(١) «تَفْسِيرُ القُرْآنِ العَظِيمِ» (٢/٥٧٦).

(٢) تەفسیری ئایەتەکان سوودم وەرگرتووە لە تەفسیری ڕێبەر، ئامادەکردنی: مامۆستا صلاح الدين عبدالكريم. –وەرگێڕ–

واتە: خوای گەورە نەفس و ماڵی لە باوەڕداران کڕیوە لە بەرامبەر ئـەوەدا بەهەشتی پێ بەخشیون.

بۆیـە پێویـستە لەسـەر بـاوەڕدار هەوڵبـدات و بزانێـت سـیفەتی ئـەهلی بەهەشت چۆنە تا خۆی پێ بڕازێنێتەوەو لە خۆیدا جێبـەجێی بکـات، وە بـە کـردەوەو ڕەوشـتی جـوان و هـەڵس و کـەوت تـا ببێـت بـە یـەکێك لـە بەهەشتییەکان.

خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ [الزخرف : ٧٢].

واتە: ئا ئەمە ئەو بەهەشتەیە کـە ئێـوە بـوون بـە میراتگـری بـەهۆی ئـەو کردەوە چاکانەی کە لە دونیادا ئەنجامتان ئەدا، (هیچ کەسێك بە کـردەوەی خـۆی ناچـێتە بەهەشـت، چـونکە کردەوەکانمـان نرخـی ئـەو هـەموو نـازو نیعمەت و بەخشش و خۆشییەی بەهەشت نییە، بـەڵکو بـە فـەزڵ و رەحمـەتی خوای گەورە دەچینە بەهەشت، وە کردەوە چـاکەکانمان هۆکـارە بـۆ چـونە بەهەشت).

ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەرئەوەی کـردەوە هۆکـارە بـۆ چـوونە بەهەشـت ... (بەڵام) تـەنها کردەوەکـردن بـەس خـۆی شایـستەی ئەوەنییـە کـەس بکاتـە بەهەشتەوە ئەگەر خوای گەورە بە فـەزڵ و ڕەحمـی ڕەحـم نـەکات و نەیکاتـە هۆکارێك بۆ چوونە بەهەشت، کردەوەکردن خۆی بۆخـۆی فـەزڵ و ڕەحمـەتی خوای گەورەیە بە بەندەکەی، بەهەشت و هۆکاری چوونە بەهەشت لە فـەزڵ و ڕەحمەتی خوای گەورەیە". [٣]

---

(٣) «جَامِعُ العُلُومِ وَالحِكَم» (ص٧٠).

ئەی براکانم لە پێناو خوای گەورە، لـە هەنـدێك فـەرموودەی دیـاریکراوی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە باسی: "**بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێ**" دەکات، ئەمە بەڵێنێکە لە کەسـێکی ڕاسـتگۆو بەڕاسـت دانـراو ﷺ، کـە ئـەویش لـە فەزڵی خوای گەورەوەیە، کـۆم کردووەتـەوەو ڕێکـم خـستووە بـەڵکو خـوای گەورە تەوفیقی منو ئێوەش بـدات زانیاریمـان هـەبێت لەسـەریو کـردەوەی پێبکەینو بانگەوازی بۆ بکەین.

## واتای بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت:

شێخ ئیبنو عوثەیمین (ڕەحمەتی خـوای لێبێـت) فەرموویـەتی: "واتـە: مـافی خۆیەتی، ئەوەی بۆی دەکات خوای گەورەیە، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خـوا ﷺ ئەوەی پێمان گەیاندووە"[٤].

---

(٤) «التَّعْلِيقُ عَلَى صَحِيحِ مُسْلِمٍ» (٣٢/٢).

### ١/ جێبەجێکردنی یەکخواپەرستی:

عَنْ سُلَيْمِ بْنِ عَامِرٍ، سَمِعْتُ أَبَا بَكْرٍ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اخْرُجْ فَنَادِ فِي النَّاسِ: مَنْ «شَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ».

قَالَ: فَخَرَجْتُ فَلَقِيَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: مَالَكَ يَا أَبَا بَكْرٍ ؟

فَقُلْتُ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: «اخْرُجْ فَنَادِ فِي النَّاسِ، مَنْ شَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ»، قَالَ عُمَرُ: ارْجِعْ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَتَّكِلُوا عَلَيْهَا، فَرَجَعْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: «مَا رَدَّكَ ؟» فَأَخْبَرْتُهُ بِقَوْلِ عُمَرَ، فَقَالَ: «صَدَقَ» [٥].

واتە: لە سولەیمی کوڕی کوڕی عامیرەوە دەفەرموویت: گوێم لە ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بوو دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لێرە دەرچۆ بانگ بکە لەنێو خەڵکو بڵێ: « هەرکەسێك شایەتی بدات بەوەی هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە الله، ئەوا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت ».

(ئەبو بەکر) دەفەرموویت: دەرچووم و گەیشتم بە عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت)، فەرمووی: ئەوە چیتە ئەی ئەبو بەکر؟

ووتم: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: « لێرە دەرچۆ بانگ بکە لەنێو خەڵکو بڵێ: هەرکەسێك شایەتی بدات بەوەی هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە الله، ئەوا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت ».

عومەر فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ من دەترسێم کە خەڵکی پاڵ بدەنەوەو کەمتەرخەمی بکەن (لە دوای بیستنی ئەو موژدە

---

(٥) رَوَاهُ أَبُو يَعْلَى فِي «مُسْنَدِهِ» (١٠٥)، وَالهَيْثَمِي فِي «مَجْمَعِ الزَّوَائِدِ» (٤)، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي في «صَحِيح الجَامِع» (٢٢٩).

گەورەیە سارد ببنەوە لە عیبادەت کردن)، گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەری خـوا ﷺ، فەرمووی: «چی گەڕاندتیـەوە؟» منـیش هـەواڵم پێـی دا بـە ووتەکـەی عومەر، فەرمووی: «ڕاست دەکات ».

وَ عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ الله ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يُشْرِكْ بِالله شَيْئًا بَعْدَ إِذْ آمَنَ بِهِ، وَأَقَامَ الصَّلَاةَ المَكْتُوبَة، وَأَدَّى الزَّكَاةَ المَفْرُوضَة، وَصَامَ رَمَضَان، وَسَمِعَ وَأَطَاعَ، فَمَاتَ عَلَى ذَلِكَ وَجَبَتْ لَهُ الجَنَّة»[٦].

واتە: لە ئەبی مالیکی ئەشعەرییەوە (ڕەزای خـوای لێبێـت) پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: « هەرکەسێك هاوبەش بۆ خـوای گـەورە بڕیـار نـەدات لـە دوای ئـەوەی کـە بـاوەڕی هێنـاوە، وە نوێـژە فـەرزەکانی بکـات،و زەکـاتی ماڵەکـەی دەربکـات،و ڕۆژووی مـانگی ڕەمـەزان بگرێـت،و گوێڕایـەڵی کاربەدەستان بکات (لە کاری چاکە)، لەسەرئەوە بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە ».

وعَنْ كَثِيرِ بْنِ مُرَّةَ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: قَالَ لَنَا مُعَاذٌ فِي مَرَضِهِ قَدْ سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْئاً كُنْتُ أَكْتُمُكُمُوهُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: « مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ »[٧].

قَوْلُهُ ﷺ: « أَكْتُمُكُمُوهُ » أَيْ أَكْتُمُ ذِكْرَ هَذَا الأَمْر عَلَيْكُم.

واتە: وە لە کەثیری کوڕی موڕڕەوە لە موعاذی کـوڕی جەبەلـەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: لای موعاذ بووین لـە کـاتی نەخۆشـییەکەیدا لـە سەرەمەرگ فەرمووی: گوێم لە ووتەیەك بووە لە پێغەمبەری خـواوە ﷺ وە من ئەوەم شاردووەتەوەو باسم نەکردووە، گوێم لێبوو پێغەمبەری خـوا ﷺ

---

(٦) رَوَاه الطَبَرَانِيُّ فِي «المُعْجَم الكَبِير» (٣٤٤٣)، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِيُّ فِي «ظِلَال السُنَّة» (١٠٤٧).
(٧) رَوَاهُ أَحْمَد فِي «مُسْنَدِه» (٢٢٠٣٤)، وَحَسَّنَهُ الأَلْبَانِيّ فِي «إِرْوَاء الغَلِيل» (٦٨٧).

دەیفەرموو: « هەرکەسێك کۆتا ووشەی لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ بێت ئەوا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت ».

کە فەرمووی (ڕەزای خوای لێبێت): « أَكْتُمُكُمُوهُ » واتە: ئەو باسەم شاردبووەوە. (لە ترسی ئەوەی نەوەکو خەڵکی ساردببنەوە لە عیبادەت کردن).

**٢/ هەرکەسێك ڕازی بێت بە الله پەروەردگاری بێتو ئیسلام دینی بێتو محمدیش ﷺ پێغەمبەری بێت:**

عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: « يَا أَبَا سَعِيدٍ مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ »[٨].

واتە: لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: « ئەی ئەبو سەعید هەرسێك ڕازی بێت بەوەی الله پەروەردگاری بێت،و ئیسلام دینی بێت،و محمدیش ﷺ پێغەمبەری بێت، ئەوا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت ».

شێخ ئیبنو عوثەیمین (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی:

کە فەرموویەتی ﷺ: «رَضِيَ بِاللهِ رَبًّا» پەروەردگارییەتی لە شەرع،و لە قەدەریش دەگرێتەوە.

أ/ پەروەردگارییەتی لە قەدەر/ ڕازی ببێت بە قەزاو قەدەری خوای گەورە، ئەگەر خۆش بوو یان ناخۆش بوو.

ب/ وە پەروەردگارییەتی لە شەرع/ ئەوەیە ڕازی بێت بە شەرعی خوای گەورە، فەرمان بێت قەدەغە کردن.

---

(٨) رواه مسلم (١٨٨٤).

خەڵك سەبارەت بە یەكەم، كە پەروەردگارییەتی لە قەدەرە، هەموویان ڕازین، هەتتا ئەگەر تورەش بن نابینیت ڕابكەن لێی.

بەڵام پەروەردگارییەتی لە شەرع، هەیانە پێی ڕازییە،و هەیانە پێی ڕازی نییە.

كە فەرموویەتی «بِالإِسْلَامِ دِينًا»: هەموو دینەكانی لێ دەردەچێت تەنها ئیسلام نەبێت، لەبەرئەوەی جگە لە ئیسلام قبوڵ نییە لای خوای گەورە، وەكو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ [آل عمران: ٨٥].

واتە: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ﴾ وە هەركەسێ جگە لە ئیسلام داوای دینێكی تر بكات‌و لەسەر دینێكی تر بێت ئەوا خوای گەورە لێی قبووڵ ناكات‌و لێی وەرناگرێ ﴿وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا لە زەرەرمەندانە وە ڕزگاری نابێت.

وە كە فەرموویەتی «وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا»: واتە شوێنی بكەوی، وە ئیللا ئێمە ڕازین بە هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت)، وە باوەڕمان وایە هەموویان پێغەمبەری خوان، وە ئەوەی كە پێی هاتوون حەق‌و ڕاستە، بەڵام ئەو پێغەمبەرەی شوێنی بكەوین، كە لەسەرمانە شوێنی بكەوین، ئەویش پێغەمبەر موحەممەدە ﷺ، بەڵام پێغەمبەرانی تر شوێنیان ناكەوین تەنها بە پێی ڕێگەدانی شەرع نەبێت[9].

---

(٩) «التَّعْلِيقُ عَلَى صَحِيحِ مُسْلِم»(١/١٧٧).

### ٣/ بانگدان:

عَنِ ابْـنِ عُمَـرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ ﷺ قَـالَ: « مَـنْ أَذَّنَ ثِنْتَـيْ عَـشْرَةَ سَـنَةً وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَكُتِبَ لَهُ بِتَأْذِينِهِ فِي كُلِّ يَوْمٍ سِتُّونَ حَسَنَةً، وَلِكُلِّ إِقَامَةٍ ثَلاَثُونَ حَسَنَةً »[10].

واتە: لە ئیبن عومـەرەوە (ڕەزای خوایـان لێبێـت) پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: « هەرکەسـێك دوانـزە سـاڵ بـانگ بـدات ئـەوا بەهەشـتی بـۆ دەبێت، وە بە هەر بانگدانێکی شەست چاکەی بـۆ دەنوسـرێت،و بـۆ هـەموو قامەتێك سی چاکەی بۆ دەنوسرێت ».

### ٤/ دوو ڕکات دوای دەستنوێژ:

عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُول اللهِ ﷺ: « مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ مُقْبِلٌ عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ إِلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ »[11].

لـە عوقبـەی کـوڕی عـامیرەوە (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەفـەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « هیچ موسڵمانێك نییە جوان دەسـتنوێژ بشوات (بەو شێوەی لە سوننەتدا هاتووە)، پاشان دوو ڕکات نوێـژ بکـات بـە دڵی و ڕووی، ئەوا ئیللا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت ».

ڕونکردنەوەیەك: "ئەگـەر کەسـێك بڵێـت: ئایـە دروسـتە بوترێـت کەسـێك بەهەشتییە لەبەئەوەی ئـەو دوو ڕکاتـە نوێـژەی کـردووە بـە دڵـی و ڕووی لـە نوێژەکە بووە لەبەر ووتەکەی ﷺ: «بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت »؟

---

(10) رَوَاهُ ابْنُ مَاجَه (٧٢٨)، وَصَحَّحَه الأَلْبَاني فِي «صَحِيح ابْنِ مَاجَه» (٥٩٤).

(11) رواه مسلم (٢٣٤).

وەلآم: ناوترێت بۆ هیچ کەسێکی دیاریکراو، چونکە لەوانەیە بەشێوەی داواکراو ئاگای لە نوێژەکە نەبووبێت، وە لەوانەیە بەهەشت بۆ کەسێك بووبێتو پاشان کردەوەیەکی ناشرین کەوتبێتە نێوان ئەوو نوێژەکەیەوە، بەلآم ئومێد دەکەین کە بەهەشتی بۆ مسۆگەر ببێت"[١٢].

### ٥/ پارێزگاریکردن لە نوێژە فەرزەکان:

عَنْ حَنْظَلَةَ الْكَاتِبِ ﵁ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ حَافَظَ عَلَى الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ رُكُوعِهِنَّ وَسُجُودِهِنَّ وَوُضُوئِهِنَّ وَمَوَاقِيتِهِنَّ وَعَلِمَ أَنَّهُنَّ حَقٌّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ أَوْ قَالَ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ»[١٣].

واتە: لە حەنظەلەوە نوسەری وەحی (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: « هەر کەسێك پارێزگاری بکات لە پێنج نوێژە فەرزەکە ڕکوعیو سوجدەیو دەستنوێژ[١٤].و کاتەکەیو بزانێت ئەمە حەقێکە لەلایەن خوای گەورەوە فەرزی کردووە ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە یان بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت ».

فەرموویەتی: واتە پارێزگاری بکات لە کاتەکەیو دوای نەخات، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ﴾ [النساء: ١٠٣].

---

(١٢) «كَشْفُ المُشْكِلِ مِنْ حَدِيثِ الصَّحِيحَيْن» (١/١٠٥).

(١٣) رَوَاهُ أَحْمَد فِي «مُسْنَدِه» (١٨٣٤٥)، وَقَالَ الأَلْبَاني: (حَسَن لِغَيْرِه) فِي «صَحِيح التَّرْغِيب » (٣٨١).

(١٤) بەو شێوەیە ئەنجامی بدات کە لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە، بۆ فێربوونی نوێژو تێگەیشتن لێی بگەڕێوە پەرتووکە بە نرخەکەی شێخ ئەلبانی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) صفة صلاة النبي ﷺ. –وەرگێڕ-.

واتــە: بــە دڵنیــایی نوێــژ کــردن فــەرز کــراوە لەســەر ئیمانــداران وە کــاتی دیاریکراوی خۆی هەیە لە کەیەوە دەست پێ دەکات وە لەکەیدا کۆتایی دێت

**٦/ بەری بوون لە کیبرو خۆبەگەورە زانینو دزیکردن لـە دەستکەوتی جەنگو قەرزاری:**

عَـنْ ثَوْبَـانَ ﵁ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ : « مَـنْ مَـاتَ وَهُـوَ بـريءٌ مِـنْ ثَلاَثٍ: الْكِبْرِ وَالْغُلُولِ وَالدَّيْنِ دَخَلَ الْجَنَّةَ »[١٥].

واتە: لە ثەوبانەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویــەتی: « هەرکەســێك بمرێــتو بــەری بێــت لــە ســێ شــت: کیــبرو خۆبەگــەورە زانــینو دزینــی دەســتکەوتی جــەنگو قــەرزاری ئــەوا دەچــێتە بەهەشتەوە ».

وَفِي رِوَايَةٍ عِنْدَ الإِمَامِ أَحْمَد ﵀ فِي «مُسْنَدِه» (٢٢٣٩٠): عَنْ ثَوْبَانَ ﵁ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: « مَنْ فَارَقَ الرُّوحُ الْجَسَدَ وَهُوَ بَرِيءٌ مِنْ ثَلاَثٍ: الْكِبْرِ وَالْغُلُولِ وَالدَّيْنِ فَهُوَ فِي الْجَنَّةِ أَوْ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ ».

وە لــە ڕیوایــەتی لای ئیمــام ئەحمــەد (ڕەحمــەتی خــوای لێبێــت) لــە موســندەکەی (٢٢٣٩٠): لــە ثــەوبانــەوە (ڕەزای خــوای لێبێــت) خزمــەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « کاتێك ڕوح لە لاشە جیا دەبێتــەوە لــە سێ شت بەری بێت: کیبرو خۆبەگەورە زانینو دزینــی دەستکەوتی جــەنگو قەرزاری ئەوا لە بەهەشتدایە یان بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت ».

کــە فەرموویــەتی: «الْغُلُول» خیانــەت کردنــە لــەو دەســتکەوتو دزینــی غەنیمەتــە پــێش دابەشــکردنی، دەوترێــت: زیــادەڕەوی کــرد لــە غەنیمــەتا زیادەڕەویە ببێتە خیانەت، هەرکەسێك خیانــەتی کــرد لــە کارێکا بەدزیــەوە

[١٥] رَوَاهُ التِّرْمِذِي (١٥٧٢)، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي فِي «صَحِيحِ التِّرْمِذِي » (١٥٧٢).

ئەوە زیادەڕەوی کردووە، ناونراوە غلول چونکە دەستەکان بەستراون لەو کارەدا یان قەدەغە کراوە تەوقێکی ئاسن کراوەتە دەسی وەکو دیل دەسی بەستراوەتەوە بۆ ملی.(١٦)

### ٧/ پەروەردەکردنی کچان:

عَنْ جَابِرِ بن عَبْدِ الله ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «مَنْ كَانَ لَهُ ثَلَاثُ بَنَاتٍ يُؤْوِيهِنَّ وَيَكْفِيهِنَّ وَيَرْحَمُهُنَّ فَقَدْ وَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ البَتَّةَ» فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَعْضِ القَوْمِ: وَثِنْتَيْنِ يَا رَسُولَ الله؟

قَالَ: «وَثِنْتَيْنِ»(١٧).

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەفەرموویێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « هەرکەسێك سێ کچی هەبێت پەنایان بداتو جێگەیان دابین بکاتو بێ پێویستیان بکاتو ڕەحمیان پێ بکات ئەوا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێتو گەڕانەوەی نییە » پیاوێك کە لەوێ دانیشتبوو فەرمووی: دوو کچیش بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟

فەرمووی: « ئەگەر دوو کچیش بێت ».

---

(١٦) «النِّهَاية فِي غَرِيب الحَدِيث وَالأَثَر» (ص٨٩٥).

(١٧) رواه البخاري فِي «الأَدَب المُفْرَد» (٧٨)، وَحَسَّنَهُ الأَلْبَانِي فِي «السِّلْسِلَة الصَّحِيحَة» (١٠٢٧).

### ٨/ هەرکەسێك منداڵی بمرێت‌و ئارام بگرێت‌و چاوەڕێی پاداشت بێت لای خوای گەورە:

عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ أَثْكَلَ ثَلَاثَةً مِنْ صُلْبِهِ فَاحْتَسَبَهُمْ عَلَى اللَّهِ .. فِي سَبِيلِ اللَّهِ [١٨].. وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ» [١٩].

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « هەرکەسێك سێ منداڵی خۆی بمرێت‌و ئارام بگرێت‌و چاوەڕێی پاداشت بێت لای خوای گەورە .. لە پێناو خوای گەورە .. ئەوا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت ».

که فەرموویەتی ﷺ: « أَثْكَلَ » لە دەستی بدات‌و بمرێت.

### ٩/ چاودێری هەتیوان:

عن زُرَارَةَ بْنَ أَوْفَى يُحَدِّثُ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ قَوْمِهِ يُقَالُ لَهُ: أَبُو مَالِكٍ أَوِ ابْنُ مَالِكٍ، سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ ضَمَّ يَتِيمًا بَيْنَ مُسْلِمِينَ فِي طَعَامِهِ وَشَرَابِهِ حَتَّى يَسْتَغْنِيَ عَنْهُ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ الْبَتَّةَ، وَمَنْ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ أَوْ أَحَدَهُمَا ثُمَّ لَمْ يَبَرَّهُمَا ثُمَّ دَخَلَ النَّارَ فَأَبْعَدَهُ اللَّهُ، وَأَيُّمَا مُسْلِمٍ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُسْلِمَةً كَانَتْ فَكَاكَهُ مِنَ النَّارِ» [٢٠].

---

(١٨) فقال أبو عُشانة مرَّة: فِي سَبِيلِ الله ... واته: ئەبو عەششانە جارێکیان فەرمووی: لە پێناو خوای گەورە. واته لە جیهاد لە ڕێگەی خوای گەورە شەهید بن، بەڵام ئەوەی ئاشکرا بێت ئەوەیە بە مردنی منداڵەکە بەبێ بەستنەوەی بە جیهاد، لەبەرئەوەی ڕیوایەت‌و بەڵگەکانی تر بەڵگەن لەسەر ئەوەی تەنها بە مردنی منداڵەکە ئەو پاداشتە گەورەیە وەردەگرن. الباحث الحديثي. –وەرگێڕ–.

(١٩) رَوَاهُ أَحْمَد فِي «مُسْنَدِه» (١٧٢٩٨)، وَالطَّبَرَانِي فِي «المُعْجَم الكَبِير»(٨٢٩)، وَصَحَّحُه الأَلْبَانِي فِي «صَحِيح الجَامِع» (٥٩٤٩).

(٢٠) رَوَاهُ أَبُو يَعْلَى فِي مُسْنَدِه (٩٢٦)، وَالطَّبَرَانِيّ فِي «المُعْجَمِ الكَبِير» (٦٧٠)، وَقَالَ الأَلْبَانِيّ: (صَحِيح لِغَيْرِه) فِي «صَحِيح التَّرْغِيب » (٢٥٤٣).

واته: له زورارەی کوڕی ئەوفا باسی دەکات، له پیاوێك له هۆزەکەی خۆی پێی فەرمووە: ئەبو مالیك یان ئیبنو مالیك، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: « هەرکەسێك کەفیلی هەتیوێك بکات لەنێو موسڵمانان له خواردنو خواردنەوە هەتتا بێ پێویست دەبێتو گەورە دەبێت ئەوا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێتو گەڕانەوەی بۆ نییە، وەهەرکەسێك دایكو باوکی یان یەکێکیان پیربن‌و لەلای بمێننەوە چاك نەبێت بۆیان، ئەوا دەچێتە دۆزەخەوەو خوای گەورە دووری دەخاتەوە، وە هەرکەسێك کۆیلەیەکی موسڵمان ئازاد بکات ئەوا دەبێتە هۆی ئازادکردنی لە ئاگری دۆزەخ ».

که فەرموویەتی ﷺ: « ضَمَّ يَتِيمًا » کەفیلی بکاتو پەنای بداتو جێگەی بۆ دابین بکاتو پێداویستییکانی [٢١].

### ١٠/ وتنی گەورەی ئیستیغفار

عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: «أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى سَيِّدِ الِاسْتِغْفَارِ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، وَأَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَعْتَرِفُ بِذُنُوبِي فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ؛ لَا يَقُولُهَا أَحَدُكُمْ حِينَ يُمْسِي فَيَأْتِي عَلَيْهِ قَدَرٌ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ إِلَّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَلَا يَقُولُهَا حِينَ يُصْبِحُ فَيَأْتِي عَلَيْهِ قَدَرٌ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ إِلَّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ» [٢٢].

---

(٢١) « التَّيْسِير بِشَرْحِ الجَامِع الصَّغِير» (٢/٨٣٠).

(٢٢) الحَدِيثُ رواه البخاري (٦٣٠٣)، وَهَذِهِ الرِّوَايَةُ عِنْدَ الترمِذِي (٣٣٩٣)، وَصَحَّحَهَا الأَلْبَانِي فِي «صَحِيح الجَامِع» (٢٦١٢).

لە شەددادی کوڕی ئەوسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: ئایە ڕێنماییت نەکەم بۆ گەورەی ئیستیغفار:

خوایە تۆ پەروەردگارمی هیچ پەرستراوێك نییە بە حـەق جگـە لـە تـۆ بـەدیت هێناومو من بەندەی تۆمو من لەسەر پەیمانو بەڵێنەکەمم کە بەتۆم داوە تـابتوانم، پـەنات پێـدەگرم لـە خراپـەی ئـەوەی ئـەنجامم داوە لـە گونـاه. دان دەنـێم بـە نیعمەتەکانتدا لەسەرمو دان دەنێم بە گوناهەکانم. سا خوایە لێم خۆشبە، بەڕاستی کەس لە گوناه خۆش نابێت جگە لە تۆ.

هیچ کەسێك نییە لە ئێوە ئێوارە بیخوێنێت لـەو شـەوەدا بمرێـت پـێش ئـەوەی بگاتە بەیانی ئەوا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت، هـیچ کەسـێك نییـە بیخوێنێـت لـە بەیانیان بمرێت پێش ئەوەی بگاتە ئێوارە ئەوا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت.

### ١١/ تێکۆشان لە پێناو خوای گەورە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِشِعْبٍ فِيهِ عُيَيْنَةٌ مِنْ مَاءٍ عَذْبَةٌ فَأَعْجَبَتْهُ لِطِيبِهَا فَقَالَ: لَوِ اعْتَزَلْتُ النَّاسَ فَأَقَمْتُ فِي هَذَا الشِّعْبِ وَلَنْ أَفْعَلَ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: « لاَ تَفْعَلْ فَإِنَّ مَقَامَ أَحَدِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَفْضَلُ مِنْ صَلاَتِهِ فِي بَيْتِهِ سَبْعِينَ عَامًا؛ أَلاَ تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَيُدْخِلَكُمُ الْجَنَّةَ؟ اغْزُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فُوَاقَ نَاقَةٍ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ » [٢٣].

واتـە: لـە ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێبێـت) فـەرمووی: پیاوێـك تێپەڕبوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێـوان دوو شـاخدا کـە لەوێـدا کانییەکی ئاوی لێبوو پیاوێکە پێی سەرسـام بـوو لەبـەر سـازگاری‌و خۆشـی ئاوەکە، فەرمووی: ئەگەر لە خەڵك دوور بکەوتمایەتەوەو خواپەرسـتیم لێـرە

---

(٢٣) رَوَاهُ التِّرْمِذِي (١٧٥١)، وَقَالَ الأَلْبَانِيّ: (صَحِيح لِغَيْرِه) فِي «صَحِيح التَّرْغِيب» (١٢٧٨).

بکردایە، بەڵام ئەوە ناکەم تا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێم پێنەدات، ئەو باسەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: « ئەو کارە مەکە چونکە شوێنی کەسێك لە ئێوە لە پێناو خوای بجەنگێت فەزڵو گەورەییەکەی زیاترە لە حەفتا ساڵ نوێژ لەماڵەوە بیکات، ئایە پێتان خۆش نییە خوای گەورە لێتان خۆش ببێتو بتانکاتە بەهەشتەوە؟ بجەنگن لە پێناو خوای گەورە، هەرکەسێك بجەنگێت لە پێناو خوای گەورە بە ئەندازەی ماوەیەکی کەمیش بێت، ئەوا بەهەشتی بۆ مسوگەر دەبێت ».

کە فەرموویەتی ﷺ: « فُوَاقَ نَاقَةٍ » ماوەیەکی کەمە، لەنێوان دوو شیرپێدانی بە بەچکەکەی لە ماوەیەکی کەم، پاشان وازی لێدێنێ تا شیرەکەی پڕ ئەبێتو بەچکەکەی لێی ئەخواتو پاشان پڕ ئەدۆشرێت، مەبەست پێی تێکۆشانێکی کەمە.

### ١٢/ هەرکەسێك وەسفو سەنای بکەن لە دوای مردنی:

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرٌ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: « وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ »، وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرٌّ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: « وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ ».

قَالَ عُمَرُ ﷺ: فِدًى لَكَ أَبِي وَأُمِّي مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرًا فَقُلْتَ: وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ، وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرٌّ فَقُلْتَ: وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « مَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْرًا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَمَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرًّا وَجَبَتْ لَهُ النَّارُ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الأَرْضِ أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الأَرْضِ أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الأَرْضِ » [٢٤].

---

(٢٤) رواه مسلم (٩٤٩).

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: جارێك جەنازەیەكیان تێپەڕكردو وەسفو سەنایان دەكرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: « بۆی مسۆگەر بوو بۆی مسۆگەر بوو بۆی مسۆگەر بوو » وە جارێكی تر جەنازەیەكیان تێپەڕكرد خەڵك باسی كرد بە خراپە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: « بۆی مسۆگەر بوو بۆی مسۆگەر بوو بۆی مسۆگەر بوو »

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: بە دایكو باوكمەوە فیدات بم جەنازەیەكیان تێپەڕكرد وەسفو سەنایان كرد فەرمووت: بۆی مسۆگەر بوو بۆی مسۆگەر بوو بۆی مسۆگەر بوو وە جارێكی تر جەنازەیەكیان تێپەڕكرد خەڵك باسی كرد بە خراپە فەرمووت: بۆی مسۆگەر بوو بۆی مسۆگەر بوو بۆی مسۆگەر بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: « ئەوەی كە وەسفی خێر كرا بەهەشتی بۆ مسۆگەر بوو، وە ئەوەی كە وەسفی شەڕو خراپەی لەسەر كرا ئەوا دۆزەخی بۆ مسۆگەر بوو، ئێوە شایەتی خوای گەورەن لەسەر زەوی ئێوە شایەتی خوای گەورەن لەسەر زەوی ئێوە شایەتی خوای گەورەن لەسەر زەوی »[٢٥].

وعَنْ أَبِي الْأَسْوَدِ الدِّيلِيِّ قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَجَلَسْتُ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ فَمَرُّوا بِجَنَازَةٍ فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا فَقَالَ عُمَرُ: وَجَبَتْ.

فَقُلْتُ لِعُمَرَ وَمَا وَجَبَتْ؟

---

(٢٥) قال المناوي ﷺ: والمراد شهادة الصحابة وغيرهم ممن كان بصفتهم لا شهادة الفسقة لأنهم قد يثنون على من هو مثلهم ولا شهادة من بينه وبين الميت عداوة لأن شهادة العدو لا تقبل. فيض القدير (٢٨/٦).

واتە: مەبەست بەو شایەتییە هاوەڵانە (ڕەزای خوایان لێبێت) وە جگە لەوانیش كە بە عەدالەت شایەتی بدەن، شایەتی ئەو كەسانە ناگرێتەوە كە فاسقن لەبەرئەوەی ئەوان وەسفی كەسێك دەكەن وەكو خۆیان بێت، وە شایەتیدان لەنێوان زیندووو مردوو نابێت هیچ ناكۆكیو دوژمنایەتی تێدا بێت، لەبەرئەوەی شایەتیدانی كەسێك كە ناكۆكیو دوژمنایەتی هەبێت شایەتی لێ وەرناگیرێت. –وەرگێڕ–

قَالَ: أَقُولُ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: « مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ لَهُ ثَلاَثَةٌ إِلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ ».

قَالَ: قُلْنَا وَاثْنَانِ؟

قَالَ « وَاثْنَانِ ».

قَالَ:وَلَمْ نَسْأَلْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْوَاحِدِ [٢٦].

واتە: وە لە ئەبی ئەسوەدی دیلی یەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموویت: چوومە مەدینە لای عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) دانیشتم، جەنازەیەکیان برد خەڵك وەسفی خێری کرد، عومەر فەرمووی: بۆی مسۆگەر بوو.

بە عومەرم ووت: چی بۆ مسۆگەر بوو؟

فەرمووی: ئەوە دەڵێم وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: « هەر موسڵمانێك سێ کەس شایەتی بدەن لەسەری ئیللا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت ».

ووتمان: ئەگەر دوانیش بێت؟

فەرمووی: « ئەگەر دوانیش بێت ».

فەرمووی: بۆ یەك کەس پرسیارمان لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکرد.

---

(٢٦) رَوَاهُ التِّرْمِذِي (١٠٧٩)، وَصَحَّحَه الأَلْبَاني فِي «صَحِيح الجَامِع» (٥٧٥٩).

## لە کۆتاییدا:

خۆشبەخت ئەو کەسەیە لە ڕێگای ڕازی بوونی خوای گەورە خێرا دەکات، کاتێك گوێبیستی ﴿ وَسَارِعُوٓاْ ﴾، وە لە گۆڕەپانو مەیدانی کاری خێردا پێشبڕکێ دەکات کاتێك گوێبیستی ﴿ فَٱسۡتَبِقُواْ ﴾ دەبێت.

ئەی براکانمو ئەی خوشکەکانم ﴿ فَٱسۡتَبِقُواْ ﴾ واتە: ئێوە پێشبڕکێ بکەن (بۆ کاری خێرو چاکە) ﴿ وَسَارِعُوٓاْ ﴾ [آل عمران: ١٣٣]. واتە: پەلەبکەن.

بە ئاگابنو وشیاربن تا هەڵنەخەڵەتێن، ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ﴾ [الحج: ٧٨].

واتە: وە جیهاد بکەن لە پێناو خوای گەورەدا بە ماڵو زمانتان جیهادێکی تەواو لە لۆمەی لۆمەکاران مەترسن.

تا ئەجرو پاداشتی بە دەست بهێنن.

خوای گەورە منو ئێوەش بکات بە یەکێك لەوانەی کە دەربارەیان دەفەرمووێت: ﴿ وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ ﴾ [طه: ٧٥].

واتە: ﴿وَمَنْ يَأْتِهِ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ﴾ بەلام هەر کەسێك بگات بە خوای گەورە بە باوەڕداری وە کردەوەی چاکی ئەنجام دابێت (کردەوەی چاك ئەوەیە کە نیەتت بۆ خوای گەورە بێتو بۆ ریات نەبێت، وە لەسەر سوننەت بێتو بیدعە نەبێت) ﴿فَأُولَئِكَ لَهُمُ الدَّرَجَاتُ الْعُلَى﴾ ئەمانە پلە بەرزەکانی بەهەشتیان بۆ هەیە.

تقبل الله منا ومنكم، ووفقنا و إياكم لكل خير.

اللَّهُمَّ انْفَعْنا بِمَا عَلَّمْتَنا، وَعَلِّمْنا مَا يَنْفَعُنا، وَزِدْنا عِلْمًا.

وَصَلَّى الله وَسَلَّمَ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين.